# کورتەی کتێبی ١٠٠ بیرۆکە
# بۆ بەڕێوەبردنی
# هەلس وکەوت و ڕەوشت(سلوک)ی
# خوێندکاران

**نووسینی:** جوني بلغ

سليمان بن أحمد السويد کورتی کردوەتەوە بە عەرەبی

**وەرگێڕانی بۆکوردی:**

مصطفى حمە سعید



«سەرپەرشتیاری پسپۆری کیمیا
لەپەروەردەیچەمچەماڵ»





# کورتەی کتێبی 100 بیرۆکە بۆ بەڕێوەبردنی هەڵس و کەوت و ڕەوشتی خوێندکاران

نووسینی : **جونی ینغ**

**سليمان بن احمد السويد** کورتی کردووەتەوە بە عەرەبی

وەرگێڕانی بۆ کوردی

**مصطفى حمە سعيد**

سەرپەرشتیاری پسپۆری کیمیا

٢٠١٢ — ٢٠١٣

چەمچەماڵ

- ناوی كتێب **كورتەی كتێبی** 100 **بیرۆكە بۆ بەڕێوەبردنی هۆڵ و كەیت و رەوشتی خوێندكاران .**
- نووسینی : **جۆنی ینغ**
- **سلیمان بن أحمد السوید** كورتی كردوەتەوە بە عەرەبی
- وەرگێڕانی بۆ كوردی: **مصطفی حمە سعید** (سەرپەرشتیاری پسپۆری كیمیا لە پەروەردەی چەمچەماڵ) .
- تیراژ : ( ١٠٠٠ ) دانە .
- دیزاین و نەخشەی بەرگ: م.عمر عبد الرحمن محمد (چەمچەماڵ)
- لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتیەكان ژمارە ( ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە .

پێشەكی : –

**((كورتەی كتێبی ١٠٠ بیرۆكە بۆ بەڕێوە بردنی هەڵس و كەوت و ڕەوشت (سلوك)ی خوێندكاران لە پۆلدا ))**

ئەمە ناونیشانی كتێبەكەی جۆنی یەنغە كە سەلام حسن خەتیب كردویەتی بەعەرەبی لە كاتی خوێندنەوەم بۆ ئەم كتێبە خاڵی جوان و بەسودم تیادا بینی . بۆیە وەرمگێرایە سەر زمانی شیرینی كوردی تا مامۆستایان و دەزگا پەروەردەیەكان لە پرۆسەی خوێندندا سوودی لێوەرگرن كە گرنگی بەڕێوەبردنی پۆلی تیادا شاراوەتەوە بە هیوای سوود گەیاندن ، توانای مامۆستا هەرچەندە زۆر و بەهێز بێت كاریگەری لە سەر خوێندكارەكانی نابێت تا گروپەكە ئامادەیی وەرگرتنی زانیاریان نەبێت كە بە ڕێكخستنی پۆل دروست دەبێت.

ئەم كتێبە لە ١٠٠ بیرۆكە پێك هاتوە یارمەتی مامۆستا دەدات بۆ ڕێكخستن و بەڕێوەبردنی پۆلەكەی ، دابەش دەبێت بۆ حەوت بەش بەم شێوەیە –:

١- خوێنکارەکانت بناسە.

٢- چۆن پارێزگاری لە ئارامی خۆت دەکەیت لە کاتی تێك چون و هەڵچونی پۆلدا ؟

٣- چۆن کارو فرمانەکان لە ڕێڕەوی راستی خۆیان دەهێڵیتەوە لەناو پۆلدا؟

٤- چارەسەری ئاستەنگە بڵاوەکان.

٥- بەخشینی پاداشت و سزا .

٦- لە پەیوەندیەکی فراواندا، واتە ئەو بیرۆکانەی کە پەیوەندیت بە خوێندکارانەوە فراوانتر دەکات .

٨- چۆن خۆت بەڕێوە دەبەیت ؟

## پێشەکی کتێبەکە

نوسەر وەك کارگێری یەکێك لە بانکەکان بۆ ماوەی شازدە سالّ کاری کردوە ، بەلاّم - وەك دەلّێ( – هیوای ژیانم بوون بە مامۆستا بوو ) ...هیوام وابوو کە کاریگەریم بەسەر نەوەیەکەوە هەبێت. بۆ جێبەجێ کردنی هیوایەتەکەی چوەتە زانکۆ کراوەکان تا تەواوی کردوەو پاشان وانەی بە فەرمان بەرەکانی بانکەکەی وتوەتەوە وەك خۆ راهێنان هەروەها پۆلی فێرکردنی ئێوارانی بۆ بەتەمەنەکان هەبووە

پاش دەست کردنی بە وانە وتنەوە توشی ئاستەنگ بووە ، لە گەلّ ئەوەی زۆر بە باشی بابەتەکەی دەزانی بەلاّم چۆنیەتی گەیاندن و وانە وتنەوەکەی نەدەزانی ، خوێندکاران هەستیان بە بێزاری دەکرد لە وانەکانیدا ، دەلّێ بەبەردەوامی هاوار و هەڕەشەم دەکرد و سزام دەدان ، لە کۆتایی هەموو وانەیەکدا زۆر ماندوو نا سەرکەوتوو دەبووم .

بەلاّم هاوەلّەکەمان خۆی نەدا بەدەستەوە ، تاوانەکەشی نەخستە سەر خوێندکارەکان و کەسانی تر بەلّك و بیری کردەوە ،

چەندە توانای گۆڕانی خۆی هەیە ، لە بارەی هەڵە شاراوەکانیەوە کە خۆی پێش کەسانی تر بیان زانێت ، بۆیە خۆی گۆڕی و سروشتی وانەکەشی گۆڕا ئەمەش لە ڕێگای سەردان و بینینی مامۆستا هاوپیشە بە ئەزمونەکانیەوە کە ئامادەی وانەکانیان دەبوو ، بەراوردی ڕێگەکانیان و هۆکارە فێرکاریەکانیانیانی دەکرد کە بەکاریان دەهێنا ، پاشان دەڵێ دەستم کرد بە پرسیار لێکردنیان و هەموو تێبینیەکانیانم دەنووسی ، پاش وتنەوەی وانەیەکی سەرکەوتوشم دادەنیشتم و بیرم دەکردەوە لە هۆکارەکەی و گرنگی سەرکەوتنەکەیم دەنوسی. بەم شێوەیە ئەزمونێکی زۆرم کۆکردەوە لە وانە وتنەوەدا. بۆ زانیاریتان هاورێکەمان مامۆستایەکی دوا ناوەندی بووە .

ئێمەش ئەی مامۆستای بەڕێز هیچمان لەو کەمتر نییە بۆ تۆمارکردنی تێبینیەکانمان ، پاشان سوود بینین لە باشەکانیان و ڕاستکردنەوەی کەم و کورتیەکان.

پێویستە ئێمەی مامۆستا ئەو پەڕی توانامان بەکار بێنین بۆ خزمەت کردنی پرۆسەی خوێندن تا نەوەیەکی باش پەروەردە بکەین و گەل و وڵاتەکەمان بەرەو سەرکەوتن و خۆشگوزەرانی زیاتر بەرین

چونکە بە پێچەوانەوە ئەگەر نەوەکانمان باش پەروەردە نەکرد زیاتر بەرەو داڕوخان دەچین ، پێویستە بگەڕێین و زیاتر وردبینەوە بۆ

١. بۆ فراوان کردن و زیاتر کردنی ئەو زانیاریانەی کە پێویستمانن بە تایبەتی ئەو بابەتەی کەدەیڵێینەوە.

٢. چۆنیەتی گەیاندنی بابەتەکە بە خوێندکاران

٣. ئامادەکردن و هێنانەوەی نموونەی بەرجەستە بۆ رونکردنەوەی وانەکان .

٤. دروست کرنی پەوەندی لە نێوان بابەتەکان و ژیانی خوێندکاراندا تا خوێندکاران ئارەزوو خۆشەویستیان بۆ فێربوون لادروست بێت .

## بەندی یەکەم : خوێنکارەکانت بناسە

**١- ناوی خوێندکارەکانت بزانە.**

چۆنیەتی لەبەر کردنی ناوەکانیان

١. شوێنی دانیشتنیان بەپێی ریزبەندی ئەلف بێی ناوەکانیان دابنێ
٢. نووسینی ناوەکانیان لە سەر مێزەکەی بەردەستت
٣. هێڵکاری پۆلەکە بکێشە کە شوێنی دانیشتن و ناوەکانیان(لە گەڵ وێنەدا ) بنوێنێ

**٢- بزانە خوێندکارەکانت گرنگی یان ئارەزوو بە چی دەدەن**

ئەمە یارمەتیت دەدات کە بابەتی سەرنج راکێشیان بۆ هەڵبژێریت و نموونەیەکیان بۆ بهێنیتەوە لە وانەکەدا کە بەبەردەوامی بە ئاگا بن بۆ وانەکە ئەمەش بەوە دەبێت لە سەرەتای ساڵەوە فۆرمێکیان بدەیتێ تا هەرکەس هیواو ئارەزووەکانی تیادا بنوسێت.

**٣- وروژاندنی هاندەرە فێرکاریەکان لە لای خوێندکاران ، بە زانینی ئامانجەکانیان لە ژیاندا .**

ئەم بیرۆکەیە لە رووی هۆکارە بەکار هاتوەکانەوە نزیکە لە خاڵی دووەم بۆ جێ بە جێ کردن وە جیاوازیشە لێی لە جۆری هانەرەکان کە گومانی تیادا نییە کە جۆراو جۆری هاندەرەکان بە ئاگابوونی خوێندکاران مسۆگەرتر دەکات ، کە ئەمە هاندەرێکی ناوەکیە ، بەهێز تر و جێگیر ترە لە هاندەرە دەرەکیەکان . بۆیە پێویستە هاندەرە ناوەکیەکان گەشە پێبدەین چونکە خوێندکار والێدەکات خۆی هەوڵ بدات و پێشبکەوێت و ئارەزوی سەرکەوتنی لادروست دەکات .

**٤- زیاد کردن و نرخاندنی هەستی خوێندکار بە زانینی گرنگی کارەکەی.**

بەزۆری خوێنکارە هاروهاجەکان بڕوا بەخۆبوونیان لاوازە واهەست دەکەن ئەو کارەی کە پێی هەڵدەسن بێ نرخە و بێ سوودە . ئەوەی پێویستە لەسەرت ئەی پەروەرشیارو مامۆستا: کە رێزو نرخاندنی خۆت بۆ هەرکار (هەوڵدان)ێك دەرببڕیت کە خوێنکارەکە

پێی هەڵدەسێت ، گرنگی ئەو کارەی بۆ ڕون بکەرەوە لە ژیانی خۆی و کەسانی تریشدا وەك (کاتی ئامادە بوونی لە خوێندنگا ، هێنانی پێویستیەکانی خۆی ، بێزار نەکردنی پۆلەکەی ، پاکوخاوێنی ، هاوکاری کردنی هاوڕێکانی لە کارێکدا ، جێ بەجێ کردنی ئەرکەکانی ، هاوبەشی کردنی لە وانەکەدا ئەگەر کەمییش بێت ... ئەمانە بنرخێنە .

ئەمەی بەبەردەوامی بۆ دووبارە بکەرەوە چونکە لە سەرەتادا بڕوات پێناکات کە ئاستی باش بووە بەڵام بە دووبارەکردنەوەی هەستی گرنگی کار لە ناخیدا دەچەسپێ و هانی دەدات بۆ کارکردن .

**٥- خۆت بە گیانی ڕوخۆشی بڕازێنەرەوە.**

ڕوخۆشی وگاڵتە کردن گرنگە بۆ دروست کردنی کەشێکی پۆلی گونجاو بۆ هەموان بەڵام دەبێت ئاگاداری ئەم خاڵانە بیت بۆ جێبەجێ کردنی ئەم بیرۆکەیە :

أ - کاتێ ئەم ڕێگەیە بەکاردێنیت کە بتوانیت پۆلەکە ڕێکخەیتەوە دوای گاڵتەکان و پۆلەکەت لە دەست دەرنەچێت

ب – هەوڵبدە گاڵتەکە پەیوەندی بە خۆت یان بابەتی وانەکەوە بێت، ئاگاداری ئەوە بە کە گاڵتەکە کەسوکارو شتە بەنرخەکانی لای خوێندکار نەگرێتەوە .

دڵنیابە لەوەی کە هەر گاڵتەیەك پەیوەندی بە خوێندکارەوە بێت لە بیری ناچێتەوە بە تانەیەك دایدەنێت ئەگەر بتوانێت لەوکاتەدا وەڵامت دەداتەوە بەڵام بەگشتی ناتوانێ وەڵامت باتەوە لە نەفسی خۆیدا هەڵی دەگرێت کە وای لێ دەکات سوود لە خۆت و وانەکەشت وەرنەگرێت و رقی لادروست بێت .

### ٦– هاورێ یان دوژمن ؟

هەندێ لە مامۆستایان خۆشەویستی بۆ خوێنکارەکانیان دەردەبڕن ئەمە باشە بەڵام نابێ لە سنوری خۆی دەرچێت ، تۆ لە پۆلدا سەرۆکایەتی دەکەیت ، وا مەبینە کە سەرکردایەتیت بۆ بکرێت بە بێ توندو تۆڵی و گورج کردنەوە لە کاتی پێویستیدا ، ئەمە بانگەشە نییە بۆ توند و تیژی لە کاتی خۆیدا نەبێت ، ئەگەر زۆر توند وتیژ بویت لە گەڵیان خۆت توشی بەرەنگار بوونەوەی ئەوان دەکەیت ، ئەگەر زۆر نەرم و نیانیش بوویت بە ئاسانی قوتت دەدەن. ئاگادار

بە !بەڵکو سنوری پەیوەندیت لە گەڵیان دیاری بکە تا خۆت و خوێندکارەکانیشت لە زۆر ئاستەنگ رزگار بکەیت . ووتویانە ئەوەندە نەرم مەبە کە بگوشرێت و ئەوەندەش رەق مەبە کە بشکێنرێیت.

## ٧- هەڵوێستت یارمەتیدەرە .

مەبەستی نوسەر لەم ناونیشانە ئەوەیە کە باری دەرونیت زۆر کاریگەرە پێش ئەوەی بچیتە پۆلەوە لە روی بەخشینی تواناکانت و وانە وتنەوەوە بۆ لایەنەکانی ( زانستی ،هەڵس وکەوت، گفتەیی ) بۆیە پێویستە دەست بەسەر هەستەکانتدا بگریت و بە روخۆشی و دڵخۆشیەوە بچیتە پۆلەوەو ( تا رادەی دروست کردنیشی ) وەك دەڵێن پێش وانەکەت بۆ ماوەی ٥ تا ١٠ خولەك وا دەرکەوە کە دڵخۆشیت ، تێبینی دەکەیت کە شتێك گۆڕاوە

## ٨- ئەستێرەی ئەمڕۆ !

با خوێندکارەکانت بزانن کە هەموو ڕۆژێك ئەستێرەی پۆل هەڵدەبژێریت ، خاڵەکانی جیاکاری لەگەڵ خوێنکارەکاندا بۆ دیاری کردنی ئەستێرەکە دیاری بکە بەم شێوەیە. .......

١- توانا : بەکار هێنانی توانایی کە خوێنکار هەوڵی زۆر دەدات بۆ فێربوون کە جێی ڕێزگرتن و نرخاندنە با ئەنجامی ڕاستیش بەدەست نەیەنێت .

٢- جیاکاری بەشداریەکەی .

٣- وەڵام دانەوەی لە وانەکەدا .

لە کۆتای وانەکەدا ئەستێرەکە ئاشکرا دەکەیت ، باشتر وایە ناوەکەی هەڵبواسیت و لە گەڵ هۆکاری بوون بە ئەستێرە ، بۆ هاندانی خوێندکارەکانی تر . ئەم بیرۆکەیە پشت بە ئارەزوی ناوەکی خوێنکار دەبەستێت بۆ جیاکاری و دەرکەوتن .

**بەندی دووەم : چۆن پارێزگاری لە ئارامی خۆت دەکەیت لە کاتی ئاژاوە و هەڵچوونی پۆلدا ؟**

**١- هێزی ڕێکخستن .**

کاتێ پێویستت بە شتێك دەبێت ( وەك پێنوس ، پەرەکاغەزێك ، ...) لە وانەکەتدا پێت نەبوو هەوڵی پەیداکردنی دەدەیت لە خوێنکارەکانتەوە یان لە پۆلەکانی تەنیشتەوە کە مایەی دروست کردنی جوڵەو دەنگی ناخۆش وناحەزلێکراوە

هەموو ئەمانە دەستی بەسەردا دەگیرێت بە ڕێکخستنی پێشەکی دەرسەکەو ئامادەکردنی پێویستیەکانی ، لە هەمان کاتدا دەبێت پێویستیەکانی خوێندکاران لەوانەکەدا بەپێی بۆچونەکانی خۆت ئامادە بکەیت .

**٢- لە باشیدا بە (کن إیجابیا) !**

واتە گفتەو دەستەواژەکانت بۆ ئاگادار کردنەوەی خوێندکارەکان یان ڕاست کردنەوەیان پێویستە باسکردنی ئەوەی تیدا بێت کە دەتەوێ لێیان نەك باسی ڕەوشتە خراپەکەیان بێت بۆ

نموونە .﴿ پێشتر ئاگادارم کردیتەوە کە واز لە دەنگەدەنگ بێنیت ، بەلاّم بەردەوامیت لە سەر نارەحەت کردنم ﴾ دەستەواژەی پێشنیار کراو ﴾ زۆر زۆر باشە وا دەردەکەوێ زۆربەی خوێندکاران گوێرایەڵن .بەلاّم هەندێ لە خوێندکاران تا ئێستا بێدەنگ نەبوون منیش هەر چاوەڕێ دەکەم ﴾ هەروەها پێویستە دەستەواژە بەکارهێنراوەکەت کۆتایی پێهێنەر بێت.

### ٣- لە قیژاندن وهاوار کردن دوور بکەوەرەوە !

لە کاتی رودانی ئاژاوە لە پۆلدا بۆ قیژاندن و هاوار کردن مەچۆ چونکە ماندوت دەکات و ووزەت پێنایەلێت ، بێ سودیشە لە گەڵ خوێندکاراندا و بەشێوەیەکی ناشایستە دەتبینن ، وا باشە ئەم هەنگاوانە جێ بەجێ بکەیت :

١- بوەستەو سەیرکە با لە چاوەکانتدا سەیرکردنێکی دیاری کراو هەبێت.

٢- دەنگت نزم بکەرەوە تا بەگران گوێیان لە دەنگت بێت بە ناچاری بێدەنگ دەبن تا دەنگی تۆ ببیستن.

٣- بوەستەو سەیری ئەوکەسە بکە کە گفت وگۆی لەگەڵ دەکەیت بۆ چەند چرکەیەك بەڵام ئاگاداری درێژکردنەوەی بە تا پیاهەڵدان(تعلیقات) دروست نەبێت .

٤- دەستت بەرز بکەرەوە بۆ بێدەنگ کردنیان.

٥- دوای ئەم هەنگاوانە لەوانەیە پێویستت بە دەنگ بەرزکردنەوە بێت بەڵام پێویستە دەستەواژەکانت کورت بێت و پاشان دەنگت نزم بکەرەوە.

## ٤- گرنگی زمانی لاشە .

کاتێ لە پۆلدایت نەك تەنها ٦٠ گوێ گوێگرن بەڵکو ٦٠ چاویش دەتبینن کە پەیوەست نین بە وتەکانتەوە بەڵو پەیوەستن بە جوڵەی لاشەتەوە ( دەستەکان ، چاواکان ، گۆڕانی دەموچاو ، وەستان ، جولان ...) پێویستە هەموو جوڵەکانت رێك بخەیت ( نەیانخەیتە ژێر مێزەکانەوە یان گرفانەکانتەوە ) لە گەڵ گرنگی زمانی لاشەدا بۆ گەیاندنی زانیاریەکان گرنگیشە بۆ بەڕێوەبردنی پۆل . ئەمە چەند یاسایەکی زمانی لاشەیە کە یارمەتیت دەدات بۆ رێکخستنی پۆل .

١- با سەیرکردن و جولانەکانت دڵنیاکارانە بێت .

٢- بە راستی بوەستە، نەك بە لاری .

٣- چاودێری خوێندکارەکانت بکە بە بەردەوامی لە رێگەی سەیرکردنتەوە .

٤- ئاگادارکردنەوەکانت بۆ خوێندکاران رادەیی هەست کردنیان بۆ چاودێریت لا دروست دەکات .

٥- بە رێکەوتن لە گەڵ خوێنکارەکاندا چەند جوڵە نیشانەیەك دابنێ کە هێما بن بۆ رێکخستنی(ضبط) پۆل.

٦- هەموو پێویستیەکانت لە بەردەستی خۆتدا دابنێ تا توشی سەرلێتێکچون نەبیت و ئاژاوە دروست نەبێت

٧- بە شێوەیەکی گونجاو راوەستە بۆ هەموو خوێنکارەکانت کاتێ تەختەرەش بەکاردێنیت

٨- لە شوێنێك راوەستە کە بتوانی چاودێری هەموو پۆلەکە بکەیت.

٩- ئاراستە فێرکاریەکانت (تعلیمات) بە لە سەر خۆی و دڵنیاییەوە دەربکە

١٠- خۆت بە دور بگرە لە پەلەپەل و سەر لەخۆشێوان .

**٥- بایەخی نیشانکاریەکان ( الاشارات ) .**

بیرۆکەکە بەندە لە سەر ڕێکەوتن لە گەڵ خوێندکاراندا لەسەر نیشانەکان کە خوێنکار مەبەستەکەت لەو نیشانەیە ڕاستەوخۆ تێبگات ، ئەمە مایەی بە خەرج نەدانی کات و توانای زۆرە .

بیرۆکەکەکان لەم بوارەدا زۆرن و جۆرەهان مامۆستا دەتوانێ بە کورتە دانیشتنێك لە گەڵ خۆیدا جۆرەها ڕێگە دابهێنێت وەك بەکارهێنانی زمانی لاشە یان هەڵواسینی وێنە (وەك نیشانە هاتوچۆکانی ماشێنەکان ) لە پۆلدا .

**٦- گەشەپێدانی سەیرکردن (النظرة ) .**

لە هۆکارەکانی پەیوەندی لە گەڵ فێرخوازەکاندا سەیرکردنیانە ، بە سەیرکردنەکانت دەتوانی ڕازی نەبوونی خۆت دەربری بەرانبەر هەڵوێستی نەشیاوی یەکێك لە خوێندکارەکانت ) بۆ نموونە بڕینی وانەکە ( نوسەر دەڵێت دەبێت کاتی خایەنراوی سەیرکردنەکە بەئەندازەی ئەوەندە بێت کە بڵێی) سەد هەزارو یەك ، سەد هەزارو دوو ، سەد هەزارو سێ ( دوای ئەمە بەردەوام بە لە

رونكردنەوەی وانەكەت ، نوسەر دەڵێت ( دڵنیابە كە ئەم ڕێگەیە كاریگەری بەهێزی دەبێت) .

**٧- رەوشت بەرز و رووخۆش بە بەهێز دەبیت .**

كاتێ خوێندكارێك خراپەیەكت بەرانبەر دەكات لە قازانجت نییە بە هەمان شێوە وەڵامی بدەیتەوە بەڵكو بە جوانترین ڕێگە و باوكانە وەڵامی بدەرەوە چونكە دەستەواژەی نەشیاو توشی ئەوەت دەكات تا بەرەو ئاستی نزمریش بچیت لە دەستەواژەكانتدا تۆ زیاتر زەرەرمەندی چونكە تۆ مامۆستایت.

**٨- هێزی جێگیربوون و بەردەوامی.**

گرنگی ئەم ڕێگەیە : دیاری كردنی پێوەرو سنورەكان و ئەركەكانە كە لە توانای خوێنكارادا هەبێت جێبەجێیان بكات و تۆش بتوانی لێپرسینەوەیان لە گەڵدا بكەیت ( وەك زۆری ئەركەكان ، سزاكان كە كات و توانایەكی چەند قاتی دەوێت ، سوپاس گوزاری بەردەوام ) بە كورتی پێویستە سروشتی (واقعی)بیت لە دانانی ئەركەكان و یاساكان بۆ ڕێكخستنی پۆلەكە تا بتوانیت جێ بەجێیان بكەیت چونكە بە ئەنجام نەگەیاندنیان ئاژاوە دروست دەكات .

لەم لایەنەوە زۆر لە مامۆستایان ئەرك دادەنێن بەڵام لێپرسینەوەی بۆ ناکەن بە بیانوی کەمی کات کە دەبێتە هۆی کەم گرنگی دانی خوێندکاران بە ئەرکەکان و بەردەوامی خوێندکاران لە سەر هەڵەکان لە وەڵامی ئەرکەکانیاندا ئەگەر هەبوو مامۆستاش هەیە ئەرك بۆ خوێندکارەکانی دانانێت بەڵام ئەو ئەرکە مایەی لاوازی توانای خوێندکارە .

## ٩- نەرم ونیان بە .

هەرچەندە بێزارکاران لە پۆلەکەتدا زۆر بوو توڕە مەبە ( لا تغضب ) بەڵکو ئارامی و نەرم و نیانی بیری خۆت بێنەوە ، چونکە بەمە وادەردەکەویت لە بەرانبەریان کە زۆر بروات بە خۆتە و هەڵس وکەوتی ئەوان توشی شەڵەژانت ناکات ، پاشان رەخنەیەکی پەروەردەیانەیان ئاراستە بکە ) باشە ! زۆربەتان دەبینم بە شێوەیەکی باش کاردەکات .بەڵام ئەوانەی لەوێن (نیشانەیان بکە ) پێویستە زیاتر هەوڵبدەن . (تۆ دەتوانی دەستەواژەی بە بهێز ترو کاریگەر تر بەکار بهێنیت.

پێغەمبەرش ( ﷺ) دەفەرموێ (إن الله رفيق يحب الرفق في الامر كله و يعطي على الرفق ما لا يعطي على غيره واتەخودا نەرم ونیانە و نەرم و نیانی پێخۆشە ئەوەی بە نەرم و نیانی دەیدات بە هیچ شتێکی تر نایدات)

## ١٠- شێوازی " لابردنی ئاگایی (صرف الانتباه )

کاتێ یەکێك لە ئاژاوە گێڕەکان دەیانەوێ راتکێشن بۆ گفتوگۆی بێ سوود و کات بە فیرۆدان خۆتی لێ بێ ئاگا بکە بەم شێوازە. :-

دان نان بە ووتە باش و راستەکانیدا ئەگەر راست بوو یان هەندێ راستی تیادا بوو ( بە بێ درێژکردنەوەو گوێدان بە هۆکاری ووتەکانی پاشان ئاگایی خوێندکاران بەرەو بابەتەکەی خۆت بەرەوە یان بۆکارێکی تر کە یەکێك لە خوێندکاران دەیکات . لێرەدا گوێشت لێ گرت و نەی توانی راتکێشێت بۆ ووتەی بێ سوود .

**١١- کارلیی وەلامدانەوەت .**

بە سوودە ئەگەر پێش روودانی ئاستەنگەکان بیرت کردبێتەوەو وەلامەکانت ئامادە کردبێت بۆ رووداوەکان: وەك (دواکەوتنی خوێندکارێك ، گفتوگۆی خوێندکاران لە کاتی وانەدا ، نە نوسینی ئەرکەکان ، ئامادە نەکردنی پێویستیەکانی وانەکە

( کتێب ، پێنوس ،.... )

ئەگەر وەلام دانەوەت لە مێشکی خۆتدا ئامادە کردبێت بە شێوەیەکی متمانە بەخۆ و بە ئاگا و دادوەر دەردەکەویت

**١٢- دلنایی بیرکردنەوەت دووبارە .**

ووتە کاریگەری زۆری دوولایەنەی هەیە (باشی و خراپی) لە بەر ئەمە دانابیە ئەگەر بیر لە کاریگەری ووتەکانت بکەیتەوە کە ئاراستەی خوێندکارانی دەکەیت بۆ رێگرتن لە دروست بوونی ئاژاوە لە ئەنجامی ووتەکانتدا . ئەمە خاڵێکی گرنگەو گرنگی دانمان بۆ ئەم لایەنە زۆر لاوازە. وەك دەڵێن خۆزگە گەردنم وەك گەردنی نەعامە بوایە بیری لە وشەکە بکردایەتەوە پیش دەرچونی لە دەم .

کوردیش دەڵێ وتەکانت بکوڵێنە پاشان دەری بکە پێویستە بزانین کە هەستی خوێندکارانیش کاریگەرە بە وتەکانمان .

**١٣– دەستەواژەی سیحری .**

نوسەر چەند دەستەواژەیەکی هەڵبژاردوە کە کاریگەری گەورەی بۆ ڕێکخستنی پۆل هەیە

- شتێك بەدەستەوە بگرەو بڵێ : کێ دەتوانێ پێم بلێ ئەمە چییە ؟
- کاتێ ژمارەیەکی کەم بەشداری وەلام دانەوە دەکەن بلێ : دەیی !چیتان بەسەر هاتوە تەنها سێ خوێندکار وەلامەکە دەزانێت ؟ !بە دلنیاییەوە نا ،دەیی ، زیاترم دەوێت.
- کاتێ دەتەوێ ئاگاداریان بکەیتەوە لە سزایەك : بڵێ ، باشە ، من نامەوێ سزاتان بدەم بەلام هیچ ڕێگە چارەیەکی ترتان نەهێلاوەتەوە بۆم.
- بۆ هێمن کردنەوەی پۆل بلێێ : تکایە دەنگتان نزم بکەنەوە ، پێنج ، چوار ، سێ ، دوو ، یەك.

**بەندی سێیەم : چۆن کارو فرمانەکان لە ڕێرەوی ڕاستی خۆیان دەپارێزی لە پۆلدا!**

١- ورەی خوێندکارەکانت بەرزکەرەوە .

ئەمەش بە ناوهێنانی باشیەکانی خوێندکارەکانت لە سەرەتای وانەکاندا یان بە دەرخستنی باشتر بوونیان لە روی ئاستیان و هەڵس و کەوتیان . وەك وتنی : سوپاسی هیوا دەکەم کە زوو گەیشتوە یان باس کردنی کەمی جوڵەی ، جێبەجیٚ کردنی ئەرکەکانی ، بەشداری کردنی لە وانەکەدا ..... هتد . ئەم کارە بە بەردەوامی هەستی بەرزبوونەوەی ئاستیان(التفوق ) لە لایان دروست دەکات و هانیان دەدات ئەم ئافەرینانە زیاتر بەدەست بێنن.

**٢- چۆن سەرەتای وانەکە نایاب و خۆش (رائع ) دەکەیت ؟**

سەرەتای وانە خاڵێکی گرنگە بۆ سەرنج راکێشانی ئاگایی خوێندکاران ، بۆیە پێویستە سەرەتایەکی هاندەر بێت ، زۆر زۆر ئاگاداربە کە سەرەتا بە سەرزەنشت و گلەیی و ئاشکراکردنی بابەتی شەڕی داتوو لە گەڵ خوێندکارەکانتدا دەست پیٚ نەکەیت . چونکە وانەکەو بابەتەکەی گەورەترین زەرەرمەند دەبن .

نوسەر چەند نمونەیەکی بۆ سەرەتای وانەکان ناو هێناوە وەك : بڕوا ! دەستت خۆش بێت بۆ تەواو کردنی ئەرکەکانت لە وانەی رابردودا ، ..... هتد . خۆزگە بۆ ماندانی سەرەتا کورتە چیرۆکێك یان وتەیەکی خۆش کە پەیوەندیان بە وانەکەوە بێت باس دەکرا یان بە چەند پرسیارێکی هەندەرانە دەستت پێدەکرد.

## ٣- بە کارهێنانی کارتی رونکردنەوەی گەورە

بیرۆکەکە ئەوەیە کە کورتە وەڵام لە لاپەرەیەکی A4 بنویسیت ، بۆ نموونە ووشەیەك بێت و دەیدەیت بە خوێندکاران لە کاتی هاتنە ژورەوەیاندا پاشان پرسیار دەکەن بۆ ئەو وەڵامانە هەرکەس وەڵامە راستەکەی لابوو بەرزی دەکاتەوە ، جیاکاری ئەم بیرۆکەیە ئەوەیە کە لە سەرەتاوەیەو پۆلەکە رێك دەخات و سەرەتای وانەکەش نایاب دەکات.

## ٤- چۆنیەتی دانی ئەرکەکان و کۆکردنەوەیان

یەکێك لە هۆکارەکانی ئاژاوەی پۆل چۆنیەتی دانی ئەرکەکان و کۆکردنەوەیانە کاتێ کە مامۆستا سەرقاڵ دەبێت پێناوە یان پشت

دەکاتە هەنێ خوێندکاری ئاژاوە چی ئاژاوە دروست دەبێت ، بۆیە نووسەر چەند ئاراستەیەکی هەیە بۆ ڕزگاربوون لەوکارە :

- بۆ هەموو پۆلێك لێپرسراو دابنێ ( لە خۆیان ) بۆ دابەشکردن و کۆکردنەوەی ئەرکەکان .
- دڵنیابە لە بەئاگایی و گوێ گرتنی خوێندکاران لە کاتی ئاراستەکانتدا بۆ ئەنجام دانی ڕاهێنانێك و دورکەوتنەوە لە هەموو خۆ سەرقاڵ کردنێك.
- کاتی پێویست بهێڵەوە بۆ کۆکردنەوەی ئەرکەکان پێش زەنگ لێدان .
- پێش کۆکردنەوەی ئەرکەکان داواکاریەکەتیان بۆ ڕوون بکەرەوە

**٥- سیانەی سیحری.**

لە جیاتی ئەوەی کە پۆلەکە هەمووی هەستێ بە جێبەجێکردنی چالاکیەك یا چەند چالاکیەك بێت ( لە سێ زیاتر نەبێت تا ئاژاوە دروست نەبێت ) ، ئەم بیرۆکەیە بەشداری هەموان مسۆگەر دەکات چونکە هەرکەس بە ئارەزوی خۆی چالاکیەکەی هەڵدەبژێرێت و کاری تیادا دەکات.

### ٦- جوانی پرسیاری هەڵبژاردن .

سەرەتایەکی باش نییە ئەگەر بە پرسیاری گران دەست پێ بکەیت بۆیە لەسەرەتاوە بە پرسیاری ئاسان دەست پێ بکەو پاشان بەرەو گرانتر . وە باشترین پرسیاری مام ناوەند هەڵبژاردنە چونکە یارمەتی بیرکەوتنەوەی وەڵامەکان دەدات

### ٨- زیاتر یارمەتی بۆ خۆت و خوێندکارەکانت

جاری واهەیە گرانی پرسیار هۆکاری دروست بوونی ئاژاوەیە لای ئەوانەی کە ناتوانن شیکاری کەن بۆیە نوسەر پێشنیاری ئەوە دەکات کە پرسیارەکە بە شێوەیەکی رونتر و ئاسانتر دارێژێتەوە بۆیان لە لاپەرەیەکی تردا .

### ٨- بەکارهێنانی هۆکاری بیستن.

نوسەر پێشنیاری ئەوە دەکات ئەو بەشەی وانەکە کە خوێندنەوەیە بەدەنگی خۆت تۆماری بکەو بۆیان لێبدە ، ئەمە یارمەتیت دەدات بۆ رێکخستنی پۆل لە دوو لاوە

یەکەم : ئاگادار بوونیان و کەمی جوڵەیان .

دووەم : دەست بەتاڵ بوونت بۆ ئاگاداربوونیان و ئاراستەكردنیان بۆ گرنگی دانیان بە وانەكە . ئەگەر وانەكە بە شێوەی بینراو ئامادە بكەیت (نموونە هێنانەوەو زیاتر روونكردنەوە وەك فلیم ، رووناك ... ) بە بەكارهێنانی داتاشۆ زۆر باشتر دەبێت بەڵام نەك بەبەردەوامی .

**٩- هەر وانەیەك سەربەخۆیە .**

جاری وا هەیە مامۆستا لە یەك بەشەوانەدا زیاتر لە وانەیەك پێشكەش دەكات بە هۆی زوو تەواو بوونی وانەی یەكەمەوە ئەمە دەبێتە هۆكاری نارێكی پۆل و بەشداری نەكردنی خوێندكاران كە مایەی : بێزاری خوێندكارانە. خۆئامادە نەكردنی پێشەكی مامۆستا بۆ وانەی دووەم كە مایەی نادروستی وانەكەیە .

**١٠- پردە چالاكی .**

زوو دەرچوونت لە چالاكیەكەوە بۆ ئەوی تر ئاژاوە دروست دەكات و هەندێ پەڵپت(الاعتراض) لێدەگرن لە بەجێ هێشتنی چالاكی یەكەم ، تا گواستنەوەت ئاسایی بێت و توشی رەخنە نەبیتەوە ، نوسەر پێشنیار دەكات كە پردی گواستنەوە لە نێوان

هەردوو چالاکیەکەدا دروست بکەیت بە داواکردن لە خوێندکاران کەسێك دیاری بکەن کە چالاکیەکە بۆ هەموان کورت بکاتەوە و گرنگترین سێ سوودی ئەو چالاکیە دیاری بکات ، ئەمە کۆتای هێنان بوو بە چالاکی یەکەم بە ڕێگەیەکی دیبلۆماسی .

**١١- چۆن چالاکی دەگۆڕیت ؟**

ئەمە تەواوکاری بیرۆکەی پێشوە ، کورتەکەشی ڕێگەیەکی ڕون و دیاری کراوت هەبێت لە گەڵ خوێندکاران کەچیت دەوێت لێیان )دەست کردن بەکار ، وازهێنان لە کار ( باشتر وایە نیشانە کراو و روون بێت بۆ خوێندکاران ، پێویستە دەستەواژەکان کۆتای پێهێنەرو راستی ئاراستەو فرمانەکان دەربخەن ) . ئەوەش ناگەیەنێت کە بە ڕوخۆشیوە ئەنجام نەدرێت.

**١٢- پشودانەوەی نایاب (الرائعە .)**

باش وایە پشویەکی کورت بدەیت بە خوێندکارەکانت بەتایبەتی دوای بەشداریکردنیان لە وانەکەدا وەك بەخشیش بەمەرجێ کورت بێت و بەهێواشی بدوێن ، تۆش سود لەم ماوە دەبینیت و خۆت

بۆ برگەی دووەم ئامادە دەکەیت ، بەلأم ئاگاداری پێدانی پشوی زۆربە نەك لە هەموو وانەیەکدا داوای بکەن .

١٣- لە سەرخۆی لە پێشکەش کردنی وانەکەدا .

هەندێ لە مامۆستایان هەوڵدەدەن کە هەموو ئارەزو پرسیارەکانی خوێندکارەکانیان جێبەجێبکەن لە گەڵ ئەوەی کە لە سەریەتی لە گەیاندنی وانە زانستیەکە ئەم کارە راستە لە لایەکەوە بەسوودە بەلأم سەرچاوەی ماندو کردنی خۆیەتی لە گەڵ لاواز بوونی بۆ پێشکەش کردنی بابەتی وانەکەی ، پەلە پەل دەکات لە وتنەوەی وانەکەیدا تا وەلأمی هەموو داواکاریەکان بداتەوە کە توشی زیاد ڕۆی دەبێت.

بۆیە پێویستە مامۆستا دلّنیا بێت لە وتنەوەی بابەتەکەو پەلە نەکات و لە کاتی وانە وتنەوەدا وانەکە نەبرێت و لە کۆتایدا بەپێی کات وەلأمیان بداتەوە . خوێندکارانیش دلّنیا بکاتەوە کە بە پێی توانا پێویستیەکانیان جێبەجێ دەکات.

**١٤- پشتگیری بینراو.**

ئەم بیرۆكەیە دانراوە لە سەر دانانی هێماو نیشانە لاپەرە كارتۆنیەكان لە پۆلدا كە یاسا رەوشتیە داواكراوەكانیان تیادا دووپات دەبێتەوە لە كاتی روودانی سەرپێچیدا مامۆستا ئیشارەت بۆ ئەو یاسایە دەكات .

هێزی كاریگەری نیشانە كردنەكە لەوەوە دێت كە خوێندكارەكە بە بەردەوامی هەست بە سەرپێچیەكەو سزاكەی دەكات ئەمەش پەیوەستە بە راستی جێبەجێكردنی سزاكە لەلایەن مامۆستاوە

**١٥- خشتەی چاودێری رەوشت .**

بیرۆكەكە لەوەوە دێت كە لە خشتەی ناوەكاندا هێما بە كاربهێنیت بۆ باری كەسەكە لە وانەكەدا ، بۆ نموونە نایاب ، زۆر باشە ، ناوەندە ، ...... هتد یان بەكارهێنانی رەنگەكان بۆ هەر ئاستێك ، ئەمە ئەگەر لە هەموو وانەیەكدا ئەنجام بدرێت بە سوود دەبێت .

## ١٦- فایلی دەسکەوت ( ملفات الإنجاز )

ئەم بیرۆکەیە هەوڵ دەدات خوێنکار باوەری بە خۆی هەبێت و یارمەتی دەدات بۆ بەشداری کردن لە وانەکەدا . کورتەکەی ئەوەیە بۆ هەر خوێندکارێك فایلێك دابنێت و هەموو دەستکەوت و پێشکەوتنەکانی لە پرۆسەی خوێندندا تیادا تۆمار بکەیت و لە بەرچاوی خۆشی بێت و ناوەکەشی بە روونی لەسەر نوسرا بێت .

لە گەڵ ئەوەی ئەم بیرۆکەیە تواناو کاتی زۆری دەوێت تا باوەری خوێندکار بەخۆی بەهێز دەکاتەوە .

## ١٧- بەڕێوەبردنی گفت وگۆ ( إدارە النقاش )

لەو بیرۆکانەیە کە ژاوەژاو و ئاژاوەی لە گەڵدا دەبێت لە پۆلدا ، خوێندکارەکان بکە بە چەند گروپێکەوەو یەکێکیان بکە سەرۆکی گروپەکە ، ناوی هەر گروپە و چی بۆ هەیە و چی لەسەرە ) بەرێکەوتن لە گەڵ خوێندکاراندا ( لە سەر تەختەرەشەکە بنوسە ، پێویستە هەموو ئەندامانی گروپەکە بەرپرس بن لە ئەنجامی کۆتایی .

## ١٨- بیرخستنەوە بۆ بەرزکردنەوەی دەست

لە هۆکارەکانی دروست بوونی ئاژاوە لە پۆلدا پرسیار کردن و وەڵام دانەوەی خوێندکارانە بە بێ مۆڵەت وەرگرتن و دەست بەرزکردنەوە ، بە هێزو بە زەبر بە بۆ ڕێکخستنی ئەمە و دۆزینەوەی چارەسەر بۆی ) بێ دەست بەرزکردنەوە خوێندکاران هیچ نەڵێن ( تا ئەم ڕێکخستنە بەرهەم دار بێت پێویستە گفتوگۆ بکەیت لە گەڵ خوێندکاراندا و سودەکانی ئەم ڕێکخستنەیان بۆ ڕوون بکەیتەوە ، پاشان بەزەبربە بۆ جێبەجێکردنی و دەست شل مەکە و وەڵامی پرسیاری سەرپێچی کاران مەدەرەوە ، دەست خۆشی و هانی گوێرایەڵان بدە ، بەردەوام ئاگاداری ئەم ڕێکخستنەیان بکەرەوە.

## ١٩- کاتی زانیاریەکان (وقت التعليمات) .

بیرۆکەی نوسەر لێرەدا ئەوەیە پاش کردنی هەرپرسیارێك کاتی پێویست بدە بە خوێندکارەکانت تا لە پرسیارەکە تێبگەن و وەڵامی بۆ ئامادە بکەن ، وەڵامی پرسیارەکە لە یەکەم کەس کە دەستی بەرز دەکاتەوە وەرمەگرە ، پێویستە شارەزابیت لەوەی کە هەر پرسیارە چەندە کاتی دەوێت بۆ وەڵادانەوە .

## ٢٠- ئاراستە كردنی پرسیار بۆ پۆلەكە.

كاتێ كە لەوانەكەدا پرسیار دەكەیت هەر ئەو گرووپە دەست بەرز دەكەنەوە كە لە وانەی رابردوو دەستیان بەرزكردبووەوە بۆیە نوسەر پێشنیاری ئەوە دەكات كە شێوەی ئاراستە كردنی پرسیارەكان بگۆڕین ، بەوەی كە پرسیارەكە لە پەرەیەك بنوسین و كاتی پێویستی وەڵام دانەوەیان پێ بدەین پاشان داوایان لێ بكەین هەركەس وەڵامی خۆی بخوێنێتەوە ئەمە ئەوە ئاشكرا دەكات كە زۆربەیان توانای وەڵام دانەوەیان هەیە بەڵام دەترسن یان شەرم دەكەن ، بۆیە ئەم رێگەیە ترسیان لە وەڵامدانەوە دەشكێنێ .

## ٢١- چۆن كار لە گەڵ وەڵامی هەڵە دەكەیت ؟

كاتێ كە خوێندكار بە هەڵە وەڵام دەداتەوە لەوانەیە پێی بڵێی هەڵەت كرد : ئەمە بڕوا بوون بە خۆی لاواز دەكات (لە گەڵ گاڵتەكردن و رابواردنی هاورێكانیدا) یان دەڵێیت باشە : بەمەش هەڵە بەراست دادەنێت كە هۆكاری سەرلێشێوانە.

بەڵام راستیەكەی ئەوەیە كە سەیری بەشە ڕاستەكەی وەڵامەكە بكەیت و دووبارەی بكەیتەوە بەشەكەیی تریشی بۆ راست

بکەیتەوە یان پێی بڵێی من دەزانم تۆ لە چ لایەکەوە سەیری پرسیارەکەت کردوە . یان هەڵەی زانا بەناوبانگەکان باس بکەو پێیان بڵێ چۆن سودیان لە هەوڵە سەرنەکەوتوەکانیان بینیوە بۆ سەرکەوتن

## ٢٢– ڕێگەیەك لە جیاتی ئاراستە کردنی پرسیارەکان .

کورتەی بیرۆکەکە ئەوەیە کە پرسیارەکان لە سەر کارتێکی ڕەنگدار کە هەر گروپێك ڕەنگی تایبەتی خۆی هەبێت و هەنگاوی یارمەتی دەر بۆ شیکارکردن لە پشت کارتەکەوە دابنرێت لە گەڵ بەئاگابوون لەم خاڵانە :

أ– دروست کردنی گروپەکان وادەرکەوێت لای خوێندکار کە هەڕەمەکیە بەڵام لای خۆت پێویستە گروپەکان بە پێی ئاستی خوێندکارەکان بێت .

ب– پێویستە هەنگاوە یارمەتی دەرەکان بۆ هەر گروپێك بە پێی ئاستیان بێت، ئاستە لاوازەکان هەنگاوی زیاتریان بدرێتێ. ئەم ڕێگەیە یارمەتی خوێندکار دەدات کە هاوبەشی بکات و هەستی بە یەکسانی تواناکانی لەگەڵ هاوڕێکانیدا لادروست دەبێت .

**٢٣- سودبینین لە بیرۆکەی بابەتەکانی تر.**

ئاسایی هۆکارەکانی رێکخستنی پۆل لای مامۆستایان لە یەك سەرچاوەوە دێت کە پەیوەندی بەبابەتەکەی خۆیەوە هەیە ، بە بەردەوامی دووبارەی دەکاتەوە ، بۆ تازەگەریش پێویستە مامۆستایان شارازایەکانی خۆیان بگۆڕنەوە لە گەڵ مامۆستایانی تردا بۆ رێکخستنی پۆلەکان ئەمەش لە رێگەی گفتوگۆ و سەردانی کردنی یەکتر لە پۆلدا دروست دەبێت ، رێگەی نوێیان بۆ دەردەکەوێت دەشێ بە گۆڕینێکی کەم بۆ وانەکەی تۆش بشێت .

**٢٤- قەدەغەکردنی بەیەکدا کێشان و شەر کردن .**

لە دیاردە نارێکەکانی بەرێوە بردنی پۆل بەیەکدا کێشان و شەری نێوان خوێندکارانە ، لە راستیدا ئەمە رووندادات بە هۆی بێ ئاگایی مامۆستا یان چاودێرەوە نەبێت ( باشترین شت بۆ چارەسەری ئەمە خێرا بەدەمەوە چون و چارەسەرکردنیەتی ئەویش بەزانینی هۆکارو پێشەکیەکانیەتی .

### ٢٥- دوای وانەیەکی خراپ چی دەکەیت.

ئەگەر دەسەڵاتی هێمن کردنەوەو هێورکردنەوەی پۆلت لە دەستدا لە یەکێك لە وانەکانتدا ، پشت گوێی مەخەو لە وانەی داهاتوودا ئەو خوێندکارانەی کە هۆکاری بشێویەکە بوون سزایی یاساییان بدە تا ئەگەر داوای یارمەتیشت لە بەڕێوەبەرایەتی خوێندنگە کردوە ، نارازی بوونی خۆت بۆ خوێنکاران روون بکەرەوەو پێیان بڵێ کە تۆ چەندە لەو کارە نارازیت ئەو کارە مایەی بەفیرۆدانی کات و لە دەست چونی بابەتەکەیە .

### ٢٦- دوو بارە دابەش کردنەوەی ئاژاوەچیەکان لە پۆلەکاندا

ئەم بیرۆکەیە لە گەڵ بیرۆکەی پێشوە ، کورتەکەی ئەوەیە کە زەبر و راستی خۆت بەرانبەر ئاژاوەگێران نیشان بدە ، نوسەر پێشنیاری ئەوە دەکات کە ئاژاوە گێرەکان بەسەر پۆلەکاندا دابەش بکرێن ( بە پێی ژمارەیان ) ، پاشان هەنگاوی گرتنەوە(احتواء)یان دەست پێ بکاتەوە ، لە گەڵ لەبەرچاوگرتنی رێسای خۆ بێ ئاگاکردن (مبدأ التغافل) .

**٢٧- بەڕێوەبردنی تاقیکردنەوەکان .**

ناوی تاقیکردنەوە لە لای خوێندکاران کاریگەری خراپی هەیە ، بۆیە نوسەر پێشنیار دەکات گۆڕان بەسەر ناوەکەدا بهێنرێت ...

وەك ئەڵقەی بیرخستنەوە

ئەڵقەکانی" چەندەت بیر دەکەوێتەوە ؟

ئەڵقەکانی " سەرم سور بێنە بە زانیاریەکانت "

**٢٨- چۆن وا دەکەیت خوێندکارەکانت ئەرکەکانیان بنووسنەوە**

دانی ئەرکەکان لە زۆر کاتدا بارگرانییە بۆ خوێندکار و مامۆستاش لە بەدواداچون و پشکنینیدا بۆیە هەندێ جار نرخی پەروەردەیی خۆی لە دەست دەدات ، پێویستە ئاگاداری ئەم تێبینیانە بیت کە یارمەتیت دەدات بۆ بە دەست هێنانی ئامانجە پەروەردەییەکان . ئەرك زیاتر لە توانای خۆت مەدە کە بۆت نە پشکێنرێت . کاتی پێویست بدە لە ماوەی دانی ئەرکەکە و وەرگرتنەوەی.

لەم ماوەیەدا ئەرکەکەیان بیربخەرەوە .

لە کاتی دواخستنی ئەرکەکان و نەهێنانی بیریان بخەرەوە لەو سزایەی کە توشیان دەبێت ئەگەر لە دوا کاتی وەرگرتنەوەی دوا کەوتن .

ئەرکی تر مەدە تا ئەوی تر لە هەموان وەردەگریتەوە یان سزای ئەوانەی کە نەیان هێناوەتەوە لە کاتی دیاریکراودا دەدەیت . بەم شێوە ئەرکەکان دەپشکنیت و نرخیش بۆ ئەرکەکان دەگێڕیتەوە

**٢٩- ئەرکی ئاسودەکاری دابنێ .**

ئاسودە بوونی خوێندکاران جێبەجێ دەبێت ئەگەر ئەرکەکان لە گەڵ ئارەزویاندا بگونجێت و شێوەی ئەرکەکان تازەگەری تیدابێت

**٣٠- پشکنین (التصحیح ) .**

نوسەر پێشنیار دەکات بۆ رزگار بوون لە درێژی کاتی سەیرکردن و راستکردنەوەی دەفتەرەکان بە دانانی چەند پێوەرێکی دیاری کراو بە رێکەوتن لە گەڵ خوێندکاراندا بۆ پشکنینیان تا زوو بگەنە ئامانج ، بۆیە پێشنیار دەکات کارەکە بکەن بە سێ بەشەوە :

ڕەنج ، ئەنجام ، جۆری . بۆ هەرسێ بوارەکە نمرەی یەکسان دابنێ ، دەتوانی بە خێرایی ئەنجامەکانیان بۆ دەربکەیت ، خاڵە بەهێزو لاوازەکان دەگرێتە خۆی و دەتوانی سەیری هەموو ئەرکەکان بکەیت و خوێندکارانیش جێبەجێی دەکەن چونکە دەزانن کە بەدوادا چون هەیە بۆی .

**٢١– دەست بەسەراگرتنی کۆتای وانە .**

نوسەر پێشنیار دەکات بۆ کارابوونی خوێندکاران لە گەڵتدا لە پێش وانەکەدا لە تەختەکە ئەمانە بنوسرێت:

أ – ئەمە لە وانەی داهاتودا جێبەجێدەکەین

ب –بۆچی ئەمە دەکەین ؟

بۆ هەردوو خاڵەکەی سەرەوە توخمە بنچینەیەکانیان بە کورتی و بە ڕونی بنوسە ، لە وانە نوێیەکەدا تەختەکە هەڵبواسەوە یان دوو بارە بینوسەرەوە .

## بەندی چوارەم : چارەسەركردنی ئاستەنگە بلاوەكان

### ١– یارمەتی بارە تاكەكەسیەكان .

جاری وا هەیە كە خوێندكارێك پێویستی بە یارمەتی هەیە كاتێ كە سەرقاڵ دەبیت پێوەی ئاژاوە دروست دەبێت لە پۆلەكەدا نوسەر دەڵێ ڕێگەی چارەسەر بەم شێوەیە دەبێت :

خوێندكارەكە بێنە لای خۆتەوە و لە تەنیشتەوە ڕایبوەستێنە تا بتوانیت چاودێری خوێنكارەكانی تر بكەیت لە گەڵ پێشكەش كردنی یارمەتی بۆی ، بەردەوام بە لە دەركردنی ئاراستەكانت بۆ خوێنكارەكانی تر تا هەست بكەن بەردەوام چاودێریان دەكەیت .

### ٢– بە دەست هێنانی نەبوەكان.

بە دروست كردنی پەیوەندی بەهێز لە گەڵ دەورووپشتی خۆت لە پرۆسەی فێركردن ( سەرپەرشتیار ، بەڕێوەبەرایەتی خوێندنگا ، مامۆستایان ) تا هاوكاری و یارمەتیت پێشكەش بكەن لە رووی زانستی و تواناییەوە .

**٣- ئیستراتیجیەتی چاوە كوێرە.**

وەستان بۆچارەسەر كردنی هەموو هەڵس و كەوتێكی نا باشی خوێندكارەكانت بە بەردەوامی وانەكە پەك دەخات و هەرا دەنێتەوە ، بۆیە نوسەر پێشنیار دەكات چاوە كوێرەت هەبێت ، دەیبینیت بەڵام لەسەر هەموو هەڵەیەك ناوەستیت بەڵكو هەڵەكان بەش بكەرەوە ، هەیانە لەسەری دەوەستیت و چارەسەری دەكەیت هەشیانە فەرامۆش كردنی باشترە بۆ بەردەوامی وانەكە كە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ شارەزای و لێزانین و كەسایەتی مامۆستا .

**٤- خراپە رەوشتی شاراوە .**

هەندێ لە خوێندكارەكانت هێمن و بەرەوشتن بەڵام لە هەمان كاتدا هیچ چالاكیەك و هەوڵدانێكیان بۆ فێربون نییە ، بۆیە ئاستیان نزمە .ئەوكێشەیەی كە توشت دەبێت بۆ چارەسەریان ئەوەیە كاتێ سەرقاڵ دەبیت بە چارەسەریانەوە ئاژاوەگێرەكان ئاژاوە دەنێنەوە لە هەمان كاتدا ناكرێ خوێندكارە لاوازەكان فەرامۆش بكەیت تا زیان بە خۆی نەگەیەنێت و كەساتی تریش چاوی لێ نەكەن.

بۆیە نوسەر پێشنیاری ئەوە دەکات کە بەردەوام بیت لە تێبینی کردنیان ، چەند ئامانجێکی قۆناغی بۆ دابنێ و لەو قۆناغەدا رازیبە بە بەئەنجام گەیاندنیان ، وە تێیان بگەیەنە کە رەوشت بەرزی و هێمنی شتێکی زۆر باشە بەڵام هاتنی بۆ خوێندنگا بۆ فێربوونە.

لە زۆربەی بارەکاندا خوێندکار دەست بە هەوڵدان دەکات کاتێ دەبینێ بەردەوام چاودێری دەکرێت .

**٥- خۆ بەپڵنگ کردنی (التنمر)ناو پۆل.**

پێویستە بە توندی بەرانبەر ئەو خوێندکارانە بوەستیتەوە کە گاڵتە بە هاورێکانیان دەکەن پاش ئامۆژگاری کردنیان و ئاگادار کردنەوەیان و گەیاندنی بارەکە بە بەرێوەبەرایەتی خوێندنگە ، بانگ کردنی کەس و کاریان و پاشان دەرکردنیان لە پۆلەکە ئەگەر بەردەوام بوون لە کارەکەیان .

**٦- یاسایەکی زێرین بۆ جیاوازی لە بیروبۆچووندا .**

یاساکە ئەوەیە کە خوێندکاران سەرقاڵت نەکەن بە دەمەدەمێوە و کاتی وانەکە بڕوات ، هەر لە سەرەتاوە پێی بڵێ کە

لەدوای وانەکە وەڵامی دەدەیتەوەو بە خێرایی وەرەوە سەر وانەکە ، ئەگەر دووبارەی کردەوە . بە هێمنی پێی بڵێ تۆ لە سەر بابەتی وانەکە گفتوگۆ ناکەیت ئەگەر کۆتای پێنەهێنا دەریبکەرە دەرەوەی پۆل بە پێی یاسا .

٦- **چۆن خۆت لە ترسناکی نامۆیان دەپارێزیت** -نامۆیان ( ئەو بیرۆکەو بوارانەیە کە پێتخۆشە گفتوگۆی لەبارەوە بکەیت ) نوسەر ئاگادارت دەکاتەوە کە خوێندکاران راتنەکێشن بۆ ئەو باسانە کە کاتی وانەکە دەگرێت ، ئەگەر لەوبارانەوە پرسیاریان لێکردی بڵێ لە کاتێکی تردا وەڵامتان دەدەمەوە کە کاتی وانەکە نەبێت یان پاش تەواو کردنی وانەکە . جاری واهەیە مامۆستا خۆی دەیەوێت لەو باسانە بدوێت.

٨- **سحری سەودا گەری (المساومە )**

کاتێ کە خوێندکاران ئەرکەکە پەسەند ناکەن سەودایان لەگەڵ بکە ( واتە وتوێژکردن ) بە کەم کردنەوەی ئەرکەکە یان سوك کردنی سزاکەیان ، بۆئەوەی ئاژاوە دروست نەبێت ، لەگەڵ یەکێکیاندا گفتوگۆ بکە بە زمانی هەموویانەوە .

**٩- گواستنەوەی خوێندکار لە شوێنەکەی.**

زۆر جار لە کاتی ئاژاوەدا بە گواستنەوەی خوێندکارێك لە شوێنەکەی خۆی کێشەت بۆ دروست دەبێت بە تایبەتی کاتێ کە لە بەرانبەر هاورێکانیدا داواکاریەکەت جێبەجێی ناکات . بۆیە نوسەر رێگەی گواستنەوە بەم شێوە پێشنیار دەکات :

- ئاگادار کردنەوی چەند جارێك پێش گواستنەوەی .
- دیاری کردنی ئەو شوێنەی کەبۆی دەنێریت لەگەڵ دورخستنەوەی کورسیەکە لە مێزەکە.
- بچۆ بۆئەو شوێنەی کە خوێنکارەکەی لەسەر دادەنیشێت دەستێکت بە کراوەی بۆ درێژ بکەو (نیو مەتر دور بە) بە دەستەکەی ترت ئاراستە بۆ شوێنە نوێیەکەی بکە ، داوای گواستنەوەی لێ بکە بە هێمنی.

ئەگەر جێبەجێی نەکرد داواکاریەکە دوبارە بکەرەوەو بڵێ ( دەمەوێ وانەکە تەواو بکەم بەڵام تۆ نایەڵیت بۆیە دەمەوێ گوێرایەڵیم بکەیت ) زۆر جار خوێنکارەکە وەڵام دەداتەوە .

ئەگەر بەردەوام بوو لە گوێڕایەڵی نەکردن کۆتای پێ نەهێنا پێی بڵێ :باشە لەمە زیاتر کاتی هاورێکانت بە تۆوە ناکوژم بەلام لە کۆتایی وانەکەدا چارەسەری کێشەکە دەکەم . پێویستە لە سەرت سزایەکی پەروەردەیی ئاراستە بکەیت چونکە هەموو خوێنکارەکانی تر چاوەرێی دەکەن ، ئەگەر لەبیرت کرد و سزات نەدا هەندێ لە خوێندکارەکانی تریش چاوی لێدەکەن .

**١٠- یەك جل پۆشین.**

لە یاساکانی خوێندنگە یەك جل پۆشینە ، چۆن چارەسەری ئەوانە دەکەیت کە گوێڕایەڵ نابن نوسەر دەڵێ یەکەم جار ئاگاداریان بکەرەوە پاشان لە پۆلدا ئاگاداریان بکەرەوە لە سەرەتادا بە هێنی و لە دوای ١٥ خولەك ناویان لە دەفتەری تێبینیەکاندا بنوسە و بڵێ بەرێوەبەرایەتی خوێندنگەی لێ ئاگاردەکەمەوە . ئاسایی زۆربەیان گوێرایەڵ دەبن ، هەرکەسیش گوێرایەڵ نەبوو بینێرە بە لای بەرێوەبەرایەتی بۆ سزادانی و مەیەڵە بێتە پۆلەوە تا گوێرایەڵ نەبێت

تێبینی : هۆی ئەم چارەسەرکردنە بۆ خوێندکارەکان روون بکەرەوە .

**١١- مۆبایل .**

بوونی مۆبایل لە پۆلدا سەرچاوەی بشێویە . پێویستە مۆبایلەکەی لێوەرگریت و بە پێی یاساکان هەڵس و کەوتی لە گەڵدا بکەیت . دڵنیاشی بکەرەوە کە مۆبایلەکەی نافەوتێت .

**١٢- زاڵ بوون بەسەر رۆتینیدا.**

هەندێ لە کێشەکانی پۆل لە بێزاری وناخۆشی وانەکەوە دروست دەبێت کە خوێندکاران بێزار دەکات ، ئەمە هەر لە سەرەتادا دەردەکەوێت ئەگەر وانەکەت بە هەمان شێوەی وانەکانی پێشوو بێت ، ئەگەر دەتەوێ لەم بێزاربوونە رزگارت بێت ئەم پێشنیارانە وەرگرە

- شوێن و جوڵەی خوێندکارەکانت بگۆرە

( ئەوانەی لە دواوە بە پێوە دەوەستن بانگیان بکە بۆلای خۆت بۆ بینینی وێنەیەك بۆ نموونە وێنەکەیان بۆ بەرزمەکەرەوە )

- وتنەوەی وانە بە داتاشۆ ، گفت و گۆی زۆری لە سەر مەکە

- دیاریەکیان لە پاکەتێدا پێ نیشان بدە ( نەزانن چییە ) کە ببێت بە دیاری بۆ باشترین خوێنکار لە کۆتای وانەکەدا بیدەرێ .

**١٣- پێنوسم پێنیە.**

نوسەر پێشنیار دەکات بۆ کێشەی نە هێنانی پێنووس خۆت چەند دانەیەکت لابێت و لە کاتی داواکردنیدا بیاندەرێ .

**١٤- پێشتریش ئەمەمان ئەنجامدا .**

لە راهێنەکانتدا ئەم رستەیەت پێدەوترێت ، تورە مەبە و بڵێ ئەمە راستە بەڵام پێویستە دووبارەی بکەینەوە ،بەڵام لە گۆشەیەکی ترەوە چونکە بابەتەکە فراوانەو پێویستمان بە دڵنیابوونەوە هەیە . ئەمە دووبارەی وانەکەیە

تێبینی : ئەگەر ئامانجت لە تەمرینەکەدا نییە دووبارەی مەکەرەوە .

**١٥- هەست بە نەخۆشی (توعك)دەکەم.**

دەستە واژەیەکە ئەگەری ڕاست و ناڕاستی هەیە لە لایەن خوێنکارەوە تا ڕاستیەکەی بزانیت بۆ ماوەی دە خولەك چاودێری بکە ئەگەر ڕاستی کرد بینێرە بۆ چارەسەر .

**١٦- گفت و گۆ لە مامۆستایەکی تر .**

خوێنکارێك ئەگەر لای تۆ لۆمەی مامۆستایەکی تری کرد ڕێگەی پێ مەدە و پێی بڵێ ئەمە بەوانەکەمانەوە تایبەت نییە ، ئەگەر هەرباسی کرد بینێرە بۆ بەڕێوەبەرایەتی خوێندنگا و کۆتایی پێ بێنە لە گەڵیدا .

**١٧- خۆهەڵواسینی هەرزەکار .**

جاری وا هەیە خوێنکار خۆی هەڵدەواسێت بە مامۆستاکەیدا بە هەر هۆیەك بێت چارەسەری ئەمە فەرامۆش کردنیەتی ، ئەگەر ویستی بابەتت بۆ بکاتەوە دەربارەی خۆی فەرامۆشی کە ؛ ئەگەر نامەی بۆ ناردی بە خێرایی بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانە ئاگادار بکەرەوە و بەشێوەیەکی ئاسایی مامەڵەی لەگەڵدا بکە بە بێ جیاوازی

**١٨- لێدوانی خراپ لە کۆڵاندا .**

لە کاتێکدا ئەگەر هەندێ لە خوێندکاران وتەی خراپیان پێوتیت لە کۆڵانەکاندا ڕێگەچارەی خێرا وەرمەگرە ، بەڵکو دوایبخە بۆ خوێندنگا ، بە ئەنجام دانی دانیشتنێك لە گەڵ خوێندکارەکەو بەخێوکارەکەیدا بە ئامادە بوونی یاریدەدەر ، ئەو ڕەوشتە ناشرینە و سزاکەی بە خوێندکارەکە رابگەیەنە ، باش وایە جاری یەکەم لێی خۆش بیت و دۆخەکە بگەڕێنیتەوە شوێنی پێش ڕوداوەکە .

## بەشی پێنجەم : دەرکردنی خەڵات و سزا.

### ١- سزای مانەوە لە خوێندنگا دوای دەوام .

نوسەر وا دەبینێ مانەوە لە خوێندنگا دوای کاتی خۆی ئەگەر سودیشی هەبێت بەڵام زیانی زیاترە لەوانە :

- دروست بونی توندی لە گەڵ خوێندکاردا.
- زیاد بوونی کردە نوسەکیەکانی مامۆستا .
- بە فیرۆدانی کات و تواناکان
- خراپی پەیوەندی خوێندکار بە خێزانەکەیەوە

نوسەر وادەبینێ پێش سزادانی ئاگاداری بدرێتە خوێندکاران و سزاکەشی دیاری بکرێت بەرون و ئاشکرایی هەموو خوێندکاران بیبیستن .

### ٢- سەری ئاژاوە چییەکان نیشان بکە.

کاتێ کە ئاژاوەیەکی گشتی لە پۆلدا روودەدات گونجاو نییە هەموو خوێندکاران سزا بدەیت چونکە هەیە بەشداری نەکردووە بەڵام

دەتوانی سێ یەکی کۆتایی سزا بدەیت چونکە ئەوان هۆکارو سەری ئاژاوە گێڕەکانن .

٣- پلەداری سزاکان.

کاتێ کە ئاژاوەیەکی گشتی لە پۆلدا ڕوودەدات بە هەڵچوون و بۆ کۆی خوێندکاران بە خێرایی سزاکان دەرمەکە چونکە دەبێتە هۆی زیاتر ئاژاوە بەڵکو فرمانێکی ڕون بەلەسەر خۆیی لە گەڵ سزاکەیدا دەربکە کە بەگشتی ڕەوشتە ناحەزەکانیان بگرێتەوە بۆ نموونە بڵێ :لەم چرکەیەوە هەریەکێك لە ئێوە بجوڵێت لە سەری ئەژمار دەکرێت ، لەکاتی سەرێچیدا ناوی سەرپێچی کار بنوسەو وەرەوە سەر وانەکەت .

٤- پیاهەڵدانی خوێندکار .

هەندێ لە مامۆستایان بۆ ڕێکخستنی پۆل دەستەواژەی ناشایستە بەکاردێنێت کە ئاراستەی دوژمنایەتی زیاد دەکات بەڵام ئەگەر دەستەواژەی پیاهەڵدانی ڕەخنە ئامێز هەڵبژێرێت زۆر نزیکە بۆ گوێرایەڵ بوون بۆ نموونە بڵێ : باخەوان تۆ دواکەس بووی کە

پێشبینی ئەوەت لێبکەم کە وانەکم پێببڕی . چونکە تۆ خوێندکارێکی گوێرایەڵیت .

### ٥- ڕاکێشانی خەڵات .

بیرۆکەکە بە دانان و ڕاکێشانی خەڵاتێکی هەفتانەیە بۆ ئەوانەی گوێرایەڵی ئاراستەکانن بە مەرجێ شتێکی سەرنج ڕاکێش و گونجاو بێت ئەشێ ئەوانەش بەشدار بکەیت کە سەرپێچیان کردوە بە مەرجەوە ، ئەگینا خەڵاتەکە ئامانجی خۆی ناپێکێت .

### ٦- سزایەکی گونجاو .

بۆ هەر هەڵەك سزایەکی گونجاوی خۆی دابنێ لە بەهێزی ولاوازیدا ، هەڵەکاری گەورە سزای گونجاوی خۆی بدە بە پێچەوانەشەوە ، ئەم گونجاویە دەبێتە هۆی ئەوەی سیستەمی سزاکان کاریگەری خۆی لە پرۆسەی خوێندندا هەبێت .

### ٧- جیاوازی بکە لە نێوان خوێندکار و هەڵسوکەوتەکەیدا .

نوسەر وادەبینی هەڵەیە تەنها رەخنە ئاراستەی خوێنکارە هەڵەکردوەکە بکرێت بەڵکو دەبێت لەگەڵ رەخنەکەدا هەندێ لە لایەنە

باشیەکانی خوێندکارەکە باس بکەیت ، تا خوێندکار ئاراستەیەکی بەرهەڵستی کردن لە خۆی وەرنەگرێت و پێویستە بزانێت رەخنەکە لە هەڵەکەیەتی نەك لە خۆی .

٨- بەخشینی خەڵات .

هەوڵ بدە هەموو کاتێ هاندەرە دیاریت هەبێت بە سوپاس و دەسخۆشی بۆ هەرکەسێك کە کارێکی باش دەکات ، باشتر وایە لە سەرەتای وانەوە بوونی خەڵاتەکە ئاشکرا بکەیت تا مایەی هاندان بێت بۆ هەموو خوێندکارەکان .

٩- خۆشی بە ڤیدیو.

نوسەر وادەبینێ خۆشی (ترفە) بدە بە خوێندکارەکانت بەڵام لە سنورێکی دیاری کراودا وەك خەڵات کردنێك بۆیان بابەتێکیان بە شێوەیکی گونجاو نیشان بدە بۆ نمونە فلیمێکی زانستی ، پێویستە هەڵبژاردنەکەت بە گۆڕانی داوای خوێندکاران نەگۆڕیت .

**بەندی شەشەم : بە گفتوگۆیەکی( نطاق ) فراوانتر**

**١- پێکهێنانی گازینۆیەك بۆ لێدوان ( دوای دوامی خوێندنگە )**

ئەمە ڕێگەیەکی باشە بۆ دروست کردنی پەیوەندیەکی بە هێز لە گەڵ خوێنکارە ئاژاوەچیەکاندا ، بیرۆکەکەش رۆژێك بۆ چاوپێکەوتن لە گەڵ خوێنکاراندا ( ڕۆژێکی کراوە لە دەرەوەی کاتی خوێندن ) دابنێ ، ئەمە یارمەتی مامۆستا دەدات زۆر لە هەڵس و کەوتە ناباشەکان چارەسەر بکات ، سەرچاوەی کاریگەریەکەش ئەوەیە کە خوێندکاران هەست دەکەن تۆ گرنگیان پێدەدەیت .

**٢- مامۆستای یارمەتی دەر .**

بیرۆکەی مامۆستای یارمەتی دەر ( دوو مامۆستا بۆ پۆلێك یان وانەیەك ) یەکێکیان سەرەکیە و ئەوی تر یارمەتی دەر کە یەکێکیان ئەوی تر تەواو بکات لە پرۆسەی خوێندندا .

بیرۆکەکە ئەوەیە کە رۆڵی مامۆستای یارمەتی دەر کارا بکەیت بە :

١- بە ئاگابوونی لە ڕێبازی تۆ بۆ وانە وتنەوە.

٢- بەشداری پێکردنی لە چارەسەر کردنی کێشەکان دەستەڵاتی باشی پێبدەیت.

٣- بوونی لە پۆلدا بۆ ڕێکخستنی ئاژاوەچییەکان

٤- بەشداری پێکردنی لە ڕونکردنەوەی وانەکە بۆ جۆراوجۆری دەنگەکان

**٣- میوانی پۆل .**

هێنانی میوانی کاریگەری بە توانا لە ڕووی زانستی یان بەهرەدارییەوە بۆ پۆل شەوق وزەوقی خوێندکاران زیاتر دەکات بەتایبەتی ئەگەر خەڵکی هەمان گەڕەك بێت کە دەبێتە هۆی توندکردنەوەی پەیوەندی خوێنکاران بە پۆلەوە سەرکەوتنی بیرۆکەکە پەیوەستە بە هەڵبژاردنی کەسی شیاوەوە ئایە کەسەکە چەندە کاریگەرە

**٤- پەیوەندی بە بەخێوکارەوە .**

ئەم کارە بە بەردەوامی جێبەجێ دەکرێت ، بەڵام ئەوەی یارمەتی کارابوونی ئەم پەیوەندیە دەدات ئەودەستەواژانەیە کە هەڵی

دەبژێریت بۆ نیشاندانی ئاستی خوێنكارەكە و ئەو ڕێگەچارەیە كە بۆ چارەسەر هەڵی دەبژێریت وەك بڵێی :باوەر.تواناى باشی هەیە و پێویستە گەشەی پێبدەین و ئاستی بەرزكەینەوە ئێوە چی پێشنیار دەكەن بۆ چارەسەر و لا بردنی ئاستەنگەكانی چارەسەركردن

**٥- بەڵگاندنی ڕێكەوتن لە گەڵ بەخێوكار .**

ئەمەش بە تۆمار كردنی ڕێكەوتنەكە و ڕێگەچارەسەرەكان كە لە نێوان مامۆستاو خوێنكارەكەدا روی داوە لەگەڵ نوسینی مێژوەكەی ، باشتر وایە كورتەی ڕێكەوتنەكە بە خوێندكارەكە بوترێت

**٦- پێكهێنانەوەی پۆل.**

تا یارمەتیت بدات بۆ ڕێكخستنی پۆل و سانایی جوڵە لە پۆلەكەدا لە ڕێگەی

١ دانیشتنی خوێنكارە ئاژاوەگێرەكان بەرانبەر خۆت

٢. جیاكردنەوەی خوێنكارە ئاژاوە گێرەكان

٣. بە پێی شوێنەكە كورسیەكان لە یەكتر دوور بخەرەوە

٤. بۆشایەك لە نێوان ریزی یەكەم و تەختەكەدا هەبێت

٥. پێویستیەکانی وانەکە لە بەر دەستدا بن

**٧- یاسا زێرینەکانی هێڵکاری دانیشتن .**

لە سەرەتای ساڵی خوێندنەوە پێویستە خوێنکارەکان و شوێنەکان بە شێوەیەك دابەش بکەیت لە خزمەتی پرۆسەی خوێندندا بێت کە تیایدا رچاوی خوێنکارە پێداویستیە تایبەت مەندیەکان و ئاژاوەچییەکان بکرێت ، پێویستە ئەم دابەش کردنە نەگۆڕیت تانها بە داوایەکی بەڵگەدار نەبێت کە زیاتر خزمەت بکات

**٨- مانەوەی خوێنکاران لە شوێنی تایبەتی خۆیان .**

نوسەر وادەبینێ کە نابێت ڕێگە بدرێت بە خوێندکار کە شوێنەکەی خۆی بگۆڕێت تەنها بە وەرگرتنی مۆڵەت نەبێت بۆیە دەبێ شوێن گۆرینی خوێنکار یان دەرچوی بۆ پێداویستی بە یاسا ریك بخەیت تا خوێندکاران سەرپێچی ئاراستەکان نەکەن .

**٩- یاسا زێرینەکانی گواستنەوەی کۆمەڵێك .**

کاتێ دەتەوێ خوێنکارەکانت بگوێزیتەوە بۆ هۆڵێکی تر بۆ ئەوەی ئاژاوە دروست نەبێت پێویستە هۆڵەکە ئامادە کرا بێت و ناو و

شوێنی هۆڵەکەو کاتی گواستنەوەکە بە خوێندکارەکان بڵێیت و خۆشت لە پێشوازیاندا ئامادەبیت

**١٠- تاك کردنەوەی یەکێك لە خوێندکارەکان .**

نوسەر دەڵێت هەڵەیە ئەگەر خوێنکارێك بۆ ڕێزلێنان یان سەرزەنشت تاك بکرێتەوە ، تا تۆمەت بار نەکرێت بە خراپی مامەڵەت لە گەڵیدا بۆیە پێویستە ئەگەر یەك کەسیش بێت هاوەڵی هەبێت

**١١- بیرخستنەوەی خوێنکاران بە هۆکاری ئەنجام دانی هەڵسوکەوتی باش .**

گوێ ڕایەڵی کردنی خوێنکاران باشتر و ئاسانتر دەبێت کاتێ دەزانن بۆچی پەیوەست بن بە یاساکان و ئامۆژگاریەکانەوە کەواتە باش وایە هۆکاری ئەنجامدانی کارەکەیان بۆ ڕوون بکەیتەوە

## بەندی حەوتەم : چۆن خۆت بەڕێوە دەبەیت ؟

### ١- دوو خشتە ( الجدولان)

خشتەی یەکەم بۆ کاتی وانەکانە و خشتەی دووەم بۆ کاتی سەیرکردنی دەفتەرەکان و پشکنینەکانە کە لە کاتی وانەکان جیاوازە ، سودی ئەم خشتەیە بۆ ڕێکخستنی کارەکانتە تا بە ئاسانی جێبەجێیان بکەیت و سەرت لێ نەشێوێت و نەزانیت چۆن و کەی کارەکانت جێبەجێ دەکەیت ، خشتەکەش پێویستە ئاسایی و بە پێی تواناکانی خۆت دابنێیت

### ٢- یەکەم کارەکان .

جاری وایە کارەکانی مامۆستا زۆرە و بۆی جێبەجێ ناکرێت بۆیە پێویستە بە پێی گرنگیان پلەبەندی بۆ ئەنجام دانی کارەکانت بکەت بەم شێوەیە

- ناکرێ ئەنجامی نەدەم .
- پێویستە ئەنجامی بدەم
- باش وایە ئەنجامی بدەم

بەم شێوەیە لای ئاسان دەبێت کە بە کام کاریان دەست پێ بکات کە لە هەموویان پێویست ترە ، باشتروایە پرسیار لە شارەزایان

بکەیت پێش دەست پێکردن

**٣- حەوانەوە ( الاسترخاء )**

پیشەی مامۆستا پیشەیەکە خاوەنەکەی زۆر توشی ئەرك و ماندوبون دەکات کە ئەمە کاریگەری زۆری لەسەر تەندروستی مامۆستا و جێبەجێ کردنی ئەرکەکەی هەیە لە خوێندنگا کەواتە یەکێك لە پێویستیەکانی مامۆستا فێر بوونی پشودان و ئارام بوونەوەیە ، دەبێ پارێزگاری لێ بکات

لە کارامەیی پشودانەوە کە نوسەر ئامۆژگاری دەدات لە کاتی دەوامدایە کە ماندوو دەبیت دەستت بە توندی بنوقێنە بە رادەی لە یەك بۆ حەوت ژماردن پاشان بیکەرەوە ، ئەمە چەندجارێك دووبارە بکەرەوە تا توندیەکەت نامێنێ و ئارامیت بۆ دەگەڕێتەوە

گرنگی بدە بە هەناسەدانەوەت بە قوڵی و بە لە سەرخۆی و جێگیری ، تەنها دە جار بەسە بۆ هێمن بونەوەت بە پێی توانا لە پۆلەکەدا بگەرێ یان لە نێوان وانەکاندا

باشتر لەمانە جێبەجێ کردنی فەرمایشتی پێغەمبەرە( صلی الله علیه وسلم )کە بۆ لابردنی تورەیی بە دەست نوێژ گرتن و نوێژکردن و شوێن گۆڕین فەرمان دەکات

**٤- تەمرینی وەرزشی.**

بۆ رزگار بوون لە پەستانە دەرونیەکانی کارکردن هەموو رۆژێك کاتژمێرێك دابنێ بۆ وەرزش کردن و لە هەفتەیەکدا سێ رۆژ ئەنجامی بدە کە وەرزشەکە توانایەکی زۆری نەوێت ، بەردەوام بە لە سەر وەرزش کردنەکەت لە هەر بارێکدا بووی

**٥- ئێوارەیەك**

رۆژێك لە هەفتەدا دابنێ کە لە کاری خوێندنگاوە دور بێت و هەناسەیەکی خۆشی تیادا بدەیت ، ئەمە تواناکانت تازە دەکاتەوەو بە چالاکی دەگەڕێیتەوە بۆ خوێندنگا

**٦- چۆن جارێکی تر دەبیتەوە بە خوێندکار سەرلەنوێ ؟**

نوسەر ئامۆژگاریمان دەکات لە کاتی ئێواراندا ببینەوە بە خوێندکاری ئێواران و وانە وەربگرین بۆ شکاندنی رۆتینەکاری رۆژانە و نوێ کردنەوەی زانیاریەکانمان و زیاد بوونی باوەر بە خۆبوون کاتێ لە زانیاریە تازەکاندا سەرکەوتن بە دەست دێنیت

**٧- خێرایت خاوبکەرەوە.**

نوسەر وادەبینێ کە ئەگەر خۆت لە سەز لەسەرخۆی بۆ خواردن و رۆیشتن راهێنا توند بوون و ماندو بوونت کەم دەکاتەوە

**٨- هاوڕێکانت.**

هەندێ لە مامۆستایان هەموو کاتی خۆیان دەدەن بە پرۆسەی خوێندن ، کەمڕەوی دەکەن لە جێبەجێ کردنی مافی هاوڕێیەتیدا بۆیە هەستی کەمتەرخەمی لادروست دەبێت ، پێویستە دۆستایەتی کەسانی تریش لە دەرەوەی پرۆسەی خوێندن بکەیت و سەردانیان لە بۆنەکاندا بکەیت .

**٩- گەرماوی گەرم.**

سوور بە لەسەر خۆشۆردن وگەرماوکردن پێش خەوتن و هەوڵ بدە بە هێمنی و ئارامیەوە بخەوە ، شەو زوو بخەوەو خۆت ماندو مەکە بە مانەوەت و درەنگ خەوتن چونکە ئەمە توشی نائارامیت دەکات و کاریگەری لە سەر تواناکانی سبەینێت دەبێت

**١٠- تۆمارێك بۆ ئەنجام دانی کارەکان .**

تۆمارێکی تایبەت ئامادە بکە بۆ تۆمار کردنی( گرنگترین کار کە ئەنجامت داوە ، گرنگ ترین بریار کە داوتە ، کاتەکانت و پلانەکانت ، با تۆمارەکەش لە بەردەستدابێت تا ماوە ماوە سەیری بکەیت و سودی لێوەرگریت. )

هیوا دارم سوودمەند بێت بۆ هەموان